برهان قانع



# بازرگانی کۆیلەکان

لەئەفەریقادا

ئەم باسە سیستەمی کۆمەلایەتی ـ ئابوری سەرمایەداری

ریسواتر ئەکات ..

برهان قانع

# بازرگانی کۆیلەکان

## لەئەفەریقادا

وەزارەتی راگەیاندن بەنوسراوی ژمارە ١٧٨
٥/٩/١٩٨٣ ریگای چاپکردنی داوە

پێشکەشە بە :

گیانی پاکی ئەو تێکۆشەرانەی لە پێناوی هەڵوەشاندنەوەی سیستەمی کۆمەڵایەتی ـ ئابوری کۆیلەداری‌دا خۆیان ماندو کردوە ..

● برهان ●

## پێشەکی :

سیستەمە کۆمەڵایەتی ـ ئابووری‌یە یەك لــە دوای یەکـــەکانی کۆمەڵــگای ئادەمیزاد گەلێك یادگاری پڕ لــە ناسۆرو دڵتەزێنیان تیایە ••
لە سەرەتای پێك هاتنی کۆمەڵــگای چینایەتیەوە ، لەو کاتەوە مەســەلەی مڵکداریتی‌و دەست بەسەراگرتن کەوتۆتە گەشە کردن ، تا لەو کــاتەوە زۆرانبــازی چینـــایەتی‌و لێـــکدان‌و پاڵەپەستۆی ئابووری‌و ناکۆکی‌یە بنچینەیی‌یەکانی ناو کۆمەڵ سەرمەشقی ژیانی ئەمڕۆمانن ••

چەوساندنەوەی مرۆڤ لە لایەن مرۆڤێکی ترەوە ، دەست گرتن بەســەر هێزەکانی بەرهــەم هێنان‌و توخمە بەرهەم هێنەرە کانا ، ڕیژیمی زۆرەملی‌یانەو سیستەمی چەوساندنەوە ، ئەمـــانە لاپەڕەی رەشی ژیان‌و دەسەڵاتی سەرمایەداری مان نیشان ئەدەن ••

گرین‌و فروشتنی ئادەمیزادو سەیر گردنی مرۆڤ وەکو کەرەسەیەکی بازرگانی‌و بەکار هێنان‌و فرۆشتنی لە لایەن مرۆڤێکی ترەوەو داگیر کردنی هێزی مەچەك‌و هۆش‌و بیر ، ماهیەتی چینایەتی‌و سەردەمی کۆیلەداری دەر ئەبرن ..

مێژووی گۆرینی کۆمەڵگای ئادەمیزاد لە زوربەی لاپەرەکانیا ژیانی تاریکی کۆیلەو رەعیەتە صرفەکانمان بۆ ئەگێرێتەوە . فرۆشتن‌و مامەڵەو مامەڵەکاری‌و بەستنی مرۆڤی زەحمەتکێش بە زەوی‌وزارەوە چمکێکە لە تاوانەکانی سیستەمی پەککەوتەی فیودالیزم (١) ، هەر وەکو راوو روت‌و جەردەیی بە ئاشکراو دەست خستنە ناو بەروبوم‌و تالانکردنی رەنجی زەحمەتکێشان نمونەیەکی بچوکی ریژیمی نیمچە کۆلۆنی‌و سیستەمە پیاو کوژەکەی چینی سەرمایەدارە ..

ئەمانەو هەزاران ناکۆکی تری ناو دەروونی کۆمەڵگای چینایەتی دەست ئاگرسێنی شۆرشێکی سەرتاپاگیری جەماوەری چەوساوەو زۆر لێکراوی ئەم جیهانە فراوانەیە .. بۆیە لە سەدەی یەکەمی بەر لە زاینی دا ، رق‌و تووڕەیی کۆیلەکان لە گۆڕەپانی شمشیر لێك راکێشاندن‌و چون بەگژی یەکتری‌دا لە پێناوی سەیرو ساتێکی پڕ لە پێکەنینی سەرمایەدارە خاوەن کۆیلەکان ، وەکو گێژەڵووکەیەك هەڵچوو ، گۆڕەپانی سەیرو سەمەرەیان گوێزرایەوە بۆ مەڵبەندی شۆرش‌و لوتکەی چیا بەرزەکانی ژورووی ئیتالیاو پەیمانی مردن‌لە پێناوی ئازادی‌دا مۆر کرا .

---

(١) Fiudalisme

(٢) Spartacos

(٣) Jladiator.

کۆیلە ئەو چینە زۆر لێکراوە بەرگەگرەیە کە توندو تیژی ئورپەیی‌و پەلاماری خۆ رزگار کردنیان ئاگری یەکەمین شۆرشی جیهانی لە پۆپەی چیای «ئالپ» داگیرسان •• بۆ رێزگرتنی گیـــانی کۆیلە راپەریوەکانی هاۆ شۆرشی «سپارتاکۆس»و هـــەمو ئەو «گلادیاتۆر»ە ئازادیخوازانەی تر کە بونە نیچیری دەستی پیاو کوژە ئەڵقە لەگوێکانی «کراسوس»(۱)• روداوێکی بچوکی «بازرگـــانی کۆیلەکان» لە ئەفەریقای ئەوکـــاتەدا پێشکەش بە خوێنەرە بەرێزەکان ئەکەین ••

**برهـان قانـع**
**۱۹۸٤**

---

(۱) Crasos:

بیستو یەکەمی ئـەیلولی ساڵی ١٧٥٦ لە یەکێك لە کەنارەکـانی ئەفەریقای رۆژئاوا کوڕێکی تەمەن یازدە ساڵەی رەش پێست کــە ناوی «ئاکویی ئیلانو» بوو فرۆشتیان بە بازرگانێکی بەریتانیایی .. ئەو منــاڵە هەژارە نەخۆش بو .. لەگەل چەندان کۆیلەی تردا خستیانە ناو ژورە چاڵەکانی کەشتییەکەوە .

**مناڵەکە وتویەتی :**

« کاتێك گەیشتمە کەنارەکە ، یەکەمین شتێك کــە بەر چاووم کەوت کەشتییەکی گـــەورە بوو چاوەڕوانی بار کردن بوو ، کاتێك بردمیانە سەر کەشتییەکە کۆمەڵێك کۆیلەی رەش پێستی هەمە جۆرەم دی .. کە بە زنجیر پێکەوە بەسترابون ، روخساریان خەمناکیو مردنی نیشان ئەدا ، بــە گورجـــی خستمیانە ناو قولایی چـــاڵی کەشتییەکەوە .. بۆنێـکی زۆر ناخۆشو توند بەر لوتم کەوت ، لە ژیانما بۆ گەنی بەو جۆرە ناخۆشم نەبیستبوو ، بە سەر یەکا کەوتنی کۆیلەکانو گەرماو هاوارو ناڵــەی

Acoiy **Eilanow.** (١)

نەخۆش‌و دەنگی گریانی ئافرەت‌و منالْ هەمو بەجـــارێ تێکەڵ بوبون • هەندێك سەتڵی شکاوو قوتولەی تیـــا بو پاشماوەکانیان تێ ئەکرد • بۆنی ئەمانە لـە هـــەمو شت ناخۆشترو زیاتر بێزاری کردبوین •• زوربەی کۆیلەکان بە دەم ئازارەوە چاوەڕوانی مردنیان ئەکرد •• مردن لـەو کاتەدا وەکو دیاری‌یەکی گرانبەها وابو ، چونکە ئـــەو هەمو ناخۆشی‌و ئازارەی لێ ئەشاردینەوە » •

ئەمە گوزەرانی چەندان ملیۆن پیاوو ژن‌و منالی ئـەفەریقایی بوو ، ئەم ئەفەریقاییانە نزیکەی ٣٥٠ سێ سەدو پەنجا ساڵ ، واتا لە [١٥٢٠ تا ١٨٧٠ ] لە رێـگای ئوقیانوسی ئەتلەسی‌یەوە لە ئەفەریقاوە ئەیانبردن بـۆ ئەمەریکا •• ئەوانە ناچار بون وەکو کۆیلە خزمەتی خەڵك بکەن •

لە سەردەمێـکی زۆر کۆنی مێژوودا عورف‌و عادەت وەهـــا بووە هەندێ خەڵك وا لێ بکەن وەکو کۆیلە بژی •• کۆیلەیەك کـــە ژیانی بەسترابێت بە خەڵـکی ترەوە • ئەبوا هـــەرچی شتێکیان پێ بسپاردایە دەمودەس جێ بەجێی بکردبایە ••

با ، ســـەرنجی کۆیلەکان بدەین بزانین چ جۆرە کارێـکیان پێ ئەکردن ؟ ئەوانە هەندێك جار خزمەتی ماڵە دەوڵەمەندەکانیان ئەکرد ، لە یۆنانی کۆندا کۆیلەکان کرێکاری یان ئیشی تری هـــەمە جۆرەیان پێ ئەکردن ••

لە رۆمی کۆندا کۆیلەکان لە کانە زیوەکانا کاریان ئەکرد •• ئیشی کشتوکاڵی‌یان ئەکرد • لە رۆژ هەڵاتی ناوەڕاستی ئیسلامی‌دا کۆیلەکان

جگە لەم ئیش‌و گارانە ئەیانگردن بە سەرباز •• «بەڵام سەربازی پێشەی هەموو رەش پێستەکان نەبوو» •• ئەلێك ئیش‌و کاری دەوڵەتی‌یان بـــەو کۆیلانە ئەسپارد کە پەیوەندی راستەو خۆیان بە سۆڵتانەکانەوە هەبووە • ئەم نەریتە لە وڵاتی میسر نزیکەی «٢٥٠» ساڵی خایاند ، کۆیلە تورکەکان لـە رێـگای دەریای رەشەوە بە سواری کەشتی ئەیانبردن بۆ میسر • • فێری مەشقی سەربازی‌یان ئەکردن ، ئەوانە پێ‌یان ئەووتن «مەملوك» • ئەم مەملوکانە لە نیوەی سەدەی سیازدەیەمەوە تاکو سەرەتای ســـەدەی پازدەیەم لە میسردا کاروباریان بەڕێوە ئەبرد ، لە هەندێك لـــە دەزگـاو دامەزراوە دەوڵەتیەکاندا •• لە هیندستان کۆیلە رەشە بنگالی‌یەکان لـە کۆتایی سەدەی پازدەیەمدا دەوڵەتێکی سەربەخۆیان دامەزراند •

«جیهانگیر» ئیمپەراتوری مەغولەکان لە بارەی کۆیلەیەکی رەشەوە کـە بو بـــە گەورەترین سەرکردەی ســـەربازی لـە سەدەی حەڤدەیەمداو لەگـەل ئیمپەراتۆری مەغول کەوتۆتە شەڕەوە ، نوسیویە ئـــەڵێ :

« مەلیك عەنبەر ، وەکو رابەر ، یان وەکو فەرماندە لـە هونەری سەربازی دا بێ وێنە بووە •• هـەمو خەڵـکی هیندستانی ناوەندی هێنا بووە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە ، تـا کۆتایی ژیانی بە شانازی یەوە ژیا ، لە هیچ شوێنێکی تری مێژوودا نەنوسراوە کە کۆیلە یەکی ئەفەریقایی بێ ئەوەی پەنا ببـاتە بـەر کەسێکی تر بتوانێت ئەو ئەرکە گەورەیە بگرێتە ئەستۆی خۆی » •

---

(١) M. Anber.

شتێکی خراپ نیە ئەوە بزانین چۆن کۆیلەکانیان ئەکرد بە سەربازو فێری مەشقی سەربازی‌یان ئەکردن‌و ئیش‌و کاریان پێ ئەسپاردن ؟. لە پێشا بەو جۆرە بو کە لە شەڕدا ئەیانگرتن ، عەرەبەکان لە ساڵەکانی داگیر کردن‌و فراوانکردنی قەڵەمڕەوی خۆیانا بەو جۆرە کۆیلەکانیان ئەگرت .. لەو کاتانەدا عەرەبەکانی ئەفەریقا گەلێك کۆیلە یان لەملاو لەو لا گرت .. لە دوایدا دەستیان کرد بە ناردن‌و فرۆشتنی ئەو کۆیلانەی کە لە خۆیان زیاد بون ، لە رۆژ هەڵاتی ئەفەریقاوە بۆ عەرەبستان‌و هیندستان‌و ئێران ، دیسان ئەو کۆیلانەی تریش کە لە رۆژ ئاوای سودان زیاد بون ئەیان ناردن بۆ وڵاتەکانی ناوچەی دەریای سپی ناوەراست . . دیسانەوە هەر لە هەمان کاتدا لە گەلێك ناوچەدا کۆیلەیان وەکو ئاژەڵ پەروەردە ئەکرد . واتا کۆیلەکانیان ناچار ئەکرد ژن بخوازن‌و منالیان هەبێت‌و منالەکانیان جێگای کۆیلەیی خۆیان بگرێتەوە .. جۆرێکی تریشی کڕینی کۆیلەکان هەبو ، هەندێی جار خەڵك خۆی حەزی ئەکرد بێتە کۆیلە ، کە ئەمەش کارێکی گەوجانەیە .. بەڵام پێویستە ئەوە بزانین کە کۆیلەکان هیچ نەبێت خواردنیان هەبووە کە بیخۆن . خەڵکی برسی‌و بێ خواردن بیریان لەوە ئەکردە وە خۆیان‌و بنەماڵەکەیان ببنە کۆیلە لەوە باشترە تاکو لە برسانا بمرن(١) .. لە وڵاتی «چین» تەنانەت دو هەزار ساڵ لەمەوبەر هەندێك خەڵك ئەیانویست منالەکانیان بکەنە کۆیلەو بیانفرۆشن(٢) .. لەو ناوچانەی کە کۆیلەکان کاروباری دەوڵەتی یان پێ ئەسپاردن .

---

(١) ئەمە روخساری دواکەوتویی سیستەمی ئابوری ئەو سەردەمەمان نیشان ئەدات .

(٢) شوێنەواری ئەو دوا کەوتوییە ئیستاش لە هەندێك ناوچەی کوردستانا ماوە کە لەکاتی شوکردنا کچەکانیان بە شیربایی ئەفرۆشن . — وەرگیر —

کۆیلەی‌و بازرگانی کۆیلە زیاتر لە دە هەزارساڵی خایاند ، بەڵام ئێمە لـەم نامیلکە بچوکەدا تەنیا رەووشت‌و جۆری بازرگانی کۆیلە لـــە ئەفەریقادا ئەکەین ، لە سەدەی شازدەیەمەوە تاکو سەدەی نوزدەیەم •• ئێمە بازرگانی کۆیلەمان لەم ناوچەیەدا کە باسمان کردوە بەسێ جـــۆر دانـــاوە :

**یەکەم** : ئەوەی کە زانیاری مان لە بارەیەوە زۆر ترە •

**دووەم** : ئەوەی کە بازرگانێتی زور ترو فراوانتر بووە ، لە چاو ناوچەکانی تر برەوی زیاتر بووە •

**سێیەم** : ئەوەی کە لەگەل بازرگانێتی ناوچـەکانی ترا جیاوازی‌یەکی زۆریان هەیە •

★ ★ ★

بازرگانی کۆیلە لە ئەفەریقادا لە دوو رووەوە جیاوازی لەگـــەل ناوچەکانی ترا هەبووە :

یەکــەم : ئەوەیە ئەم بازرگانی‌یە بەرەو بومی بازاڕی جیهانی بووە ، بازاڕی جیهانی بەمانا تەرخان کردن یان تا یبەتە •• یەکێك لە شێوەکانی ئەم تایبەتە بەرهـــەم هێنانی خۆراك‌و کەرەسەی خاوە لە ناوچـــە ژێر دەستەکانا ، لەگەل ئەوەدا لە سەردەمە کۆنەکانا کۆیلە کـــان کـــاری تایبەتیان نەبووە ، بەڵـکو گـــەلێك کاروباری تریان پێ سپێردراوە • • بەڵام لــە وڵاتانی ئەمەریکادا بە شێوەی گشتی ئیش‌و کاری کشتوکاڵیـــان پێ ئەکردن ••

دووەم : لە ئەفەریقادا مەسەلەی کۆیلەکان لەگەل چەندان جـــۆر نژادو رەنگ‌و رەگەزی تردا تێکەڵ بوبون •

لە رۆژگاری کۆندا بە چەندان شێوەی جیاجیا لەگەل کۆیلەکـــان

رەفتاریان ئەکرد • خەڵکی ئازاد لەگەڵ کۆیلەدا گەلێك جیاوازی هەبووە • کۆیلەکان کاتێك دەستیان لەکار هەڵ ئەگرت ئەیانتوانی لەگەل یەکتردا دانیشن •• هەندێك لە خاوەن کۆیلەکان وەها بیریان ئەکردەوە کە رەش پێستەکان ئاستی مرۆڤایەتی‌یان نزمە •• کۆیلە ئەفەریقایەکان هەمویان رەش پێست بون ، بەڵام خاوەنەکانیان هەموو سپی پێست بون •• خاوەن کۆیلەکان بە سوکی‌یەوە سەیری کۆیلەکانیان ئەکرد •• ئێمە تا ئێستاش ئەنجامی ئەم جیاوازی رەگەزو رەنگە لە گەلێك شوێنداو بە تایبەتی لە ئەفەریقادا ئەبینین •

## سەرەتای بازرگانی کۆیلە
## لە رێگای ئوقیانوسی ئەتلەسەوە

لە میسری کۆن دا ، لە ئەفەریقاوە کۆیلەیان ئەهێنا •• میسریەکان بە درێژایی سەدان سال کۆیلە رەش پێستەکانیان ئەکڕی‌و ئەیانفرۆشتنەوە •• بەڵام بازرگانی کۆیلە لە دوای ساڵی «١٦٠٠» ، وە لە رێگای ئەوروپاییەکانەوە برەوی پەیدا کرد ، دەریاوانە پورتوگالی‌یەکان یەکەمین ئەوروپاییەك بون کە لە ناوەڕاستی سەدەی پازدەیەمدا چوونەتە کەنارەکانی ئەفەریقای رۆژ ئاواوە • ئەوانە کۆیلەکانیان ئەکڕی ، یان ئەیانگرتن‌و لە رێگای دەریاوە ئەیانبردنەوە بۆ پورتوگال ••

نوسەرێکی پوروتوگالی لە سەدەی پازدەیەمدا بەمجۆرە باسی هێنان‌و بردنی کۆیلەکانی کردوە :

> « هەندێکیان سەریان دانەواندبو ، هەموو لەشیان بە فرمێسك تەڕ بووبوو ، سەیری یەکتری‌یان ئەکرد ، هەندێکیان هاواریان ئەکردو سەریان بۆ ئاسمان بەرز ئەکردەوە ، هەندێك جار بە قایم ئەگریان ، هەندێك بە

چەپۆك لە خۆیان ئەدا ، هەندێك خۆیان دابو بە زەویدا •

کاتێك ئەوانە ئەهـاتن کۆیلەکانیان دابـەش ئەکرد هاوارو گریانی کۆیلەکان زۆر تر ئەبو •• ئەمانە پێیان سپێردرابو کۆیلەکان بەش بەش بکەن‌و لە یەکتر جیایان بکەنەوە •• واتا ژنەکان لە پیاوەکان جیا بکەنەوە ، برا لە برا ، باوك لە کوڕ ، هەموویان لە یەکتری جیا بکەنەوە ، نەك بـە پێی پەیوەندی بنەماڵەکـــان •• هیچ گوێیان بە هاواری کۆیلەکـــان نەئەدا • بە ئارەزوی خۆیان هەر بەشێکیان ئەنارد بۆ شوێنێك •

نـــە پورتوگالی‌یەکان‌و نە بازرگانە ئەفریقا یيەکـــان مەســەلەی کۆیلەکانیان بـە کارێـــکی ناشیرین‌و خراپ نە ئەزانی ، هـــەروەها ناوچەیەکی تریش کە پێی ئەڵێن «دورگەکانی ئانتیل» ئەویش ناوچەیەکی تر بو کە ئەمجۆرە بازرگانێتی‌یەی تیا ئەکرا •

ئەسپانیاییەکان لـــە نێوان ساڵەکانی ١٤٩٢ تا ١٥٢٠ دورگـەکانی «وست ئینریین»و هەندێك ناوچەی ئەمەریکای ناوەندو خوارویان داگیر کرد • ئەوروپاییەکان دەستیان کرد بە سود وەرگرتن لە سامانی جیهـانی نوێ ، لـــە کانزەکانی چیای «ئاند» زێڕو زیوو ، لـــە کێڵـگە تازەکانی «بەرازیل» شەکریان ئەنارد بۆ ئەوروپا •• خەڵکە ئەمەریکاییەکان ناچـار بون کە وەکو کۆیلە کار بۆ سپی پێستەکان بکەن •

بەڵام ئەوانە لە ئەنجامی رەفتاری توندو تیژی ئەوروپاییەکان بـــە گورجی ئەمردن • سپی پێستەکان بە بیـانووی ئەوەی کۆیلەکان کـەمن دەستیان کرد بـە هێنانی کۆیلەی بەهێـزو هـــەرزان ، لە ئەفەریقـــای رۆژئاواوە • واتا پیاوو گەنجی بەهێز کە لە واقیع دا بە کۆیلەی باش دا ئەنران • ئەفەریقاییەکان لەو بارە ناخۆشەی ئەوروپادا زۆر تر هــەڵیان

ئەکرد ، دیسان ئەوە دەرکەوت کە لە کۆیلە ئەمەریکاییەکان خۆراگرترو بەهێز ترن •

زوربەی دەوڵەتەکانی کەناری ئەوروپا تاکو ساڵی ١٦٥٠ چەند ناوچەیەکی ئەمەریکایان بەدەستەوە بو •• وەکو ئەسپانیا لە ئەمەریکای ناوەندو خوارو ، هۆڵەندەو پورتوگال لە بەرازیل ، بەریتانیاو فەرەنسە لە دورگە کانی ئانتیلو ژورووی ئەمەریکا •• هەموو ئەمانە لە ئەفەریقاوە کۆیلەیان ئەبرد •

لە سەدەکانی حەڤدەو هەژدەیەمدا خەڵکی ئەوروپا زۆر تر سودیان لە بەروبومی ناوچە گەرمە سێرەکانو وەر ئەگرت وەکو : شەکر ، چایی ، قاوە ، توتن ، لۆکە ، نیلو ••• لە ئەمەریکا ئەمانەیان بە هۆی کۆیلەکانەوە بەرهەم ئەهێنا ، هەرچەند کێڵگەکان فراوانتر بونایە کۆیلەی زیاتر یان لە ئەفەریقا ئەکڕی •

ئەو ئەوروپاییانەی کە لەگەل ئەفەریقای رۆژ ئاوادا پەیوەندی بازرگانییان هەبو لەوانە زێڕ ، عاج ، داوو دەرمانیان ئەکڕی •• بەلاَم تا سەدەی حەڤدەیەم کۆیلەکان گەورەترین مەسەلەی بازرگانی بون • پورتوگالیەکان کاتێك بۆیان دەرکەوت کە توانای ئەوەیان نیە کۆیلەی زیاد بکڕن بە زۆر ئەیانگرتن •• لەم رووەوە پادشای مەسیحیەکانی «کونگو»(١) لە ساڵی ١٥٠٦ تا ١٥٤٣ لە بارەی بازرگانی کۆیلە کانەوە بەمجۆرە رەخنەی لە پادشای پورتوگال گرتوە :

«گەورەم ، گەلێك لە خەڵکی ئێمە حەز بە کەلوپەلی(٢)

---

(١) Congo.

(٢) لەو سەردەمەدا کۆیلەش بە کەلوپەل دائەنرا

وڵاتی ئێوه ئەکەن ، ئەم کەلوپەلانە خەڵکی لای ئێوه بـۆ ئێرەی ئەهێنن ، بەڵام ئەوانـە بۆ ئـەوەی قازانج زۆر تر بکەن خەڵکە ئازادەکانی ئێمە ئەدزن ، زۆر جـــار منالیان دزیوە ، دواجار بە سپی پێستەکانیان ئەفرۆشن ، ئێمـە بۆ بەرگرتن لەم کارە نامروڤانەیە یاسایەکمان داناوە ، بەپێی ئـەو یاسـایە ، هەر سپی پیستێك لـە ناوچەو شـــوێن و قەڵەمڕەوی ئێمەدا ئەژی و ئەیەوێت هەر جۆرە کەلەپەلێك بـکڕێ پێویستە بەر لـــە کڕینی چـــەند کەس لـــە لێپرسراوانی ئێمە ئاگادار بـکات ، کە ئایا ئەو کەلوپەلە دزراوە یان ئازادە •

★ ● ★

## کۆیلەداری لە ئەفەریقای رۆژئاوادا :

تاکو ساڵی ۱۷۰۰ زوربەی ولاتە ئەوروپاییەکان لەگەل ئەفەریقـای رۆژئاوادا پەیوەنـــدی بازرگـــانی یان هـــەبو ، کومپانیا بازرگـانی یە ئەوروپاییەکان بە درێژایی کەنارەکانی رۆژئاوای ئەفەریقا چەندان قەڵایان دروست کردبو • لە هەریەك لـەم قەڵایانەدا کەلوپەلی بازرگانی یان بـــۆ گۆرینـــەوە لەگەل دیلەکانو بەروبومی تردا هەمار کردبو •• بازرگـانو حاکمە ئەفەریقاییەکان کۆیلەو بەروبومەکانیان ئەفرۆشت بە ئەوروپاییەکان ئاوو هـــەوای ئەفەریقای رۆژ ئاوا زۆر گـــەرمو ناخۆش بو ، کـــە ئەوروپاییەکان لێی بێزار بون ژمارەیەکی زۆر لە سپی پێستەکان لـەبەر ناجۆری ئاوو هەواکـــە ئەمردن • تاکو سەدەی نۆزدەیەم کەنارەکـانی رۆژئاوای ئەفەریقا وەکـو گۆرستانی سپی پێستەکانی لێ هاتبوو • ژیـان لەناو ئـەو قەڵایانەدا بـــە نیسبەت بازرگانی ئیشـــکەرو ســـەربازە ئەوروپاییەکانەوە زۆر ناخۆش بو •

پادشا ناوچەیەکانو بازرگـانە ئەفەریقاییەکان لەگـەل بازرگانە ئەوروپاییەکانا هاوبەش بون • ئەوانە لـە خانووی قوڕینەو بەدار دارەڕا کراودا ئەژیان ، ئەم خانوانە لـە پشت دیواری قەڵاکانەوە کرابونەوە ، کۆیلەکانیان بە ئاسن ، قامیشی شەکر ، کوتاڵی پەشم ، تفەنگ کـە لـە ئەوروپاوە ئەهـاتن ، ئەگۆڕینەوە • لـە ئەنجامدا سامانی حاکمـە ئەفەریقاییەکان بە هۆی بازرگانی کۆیلەوە زۆر بو ، هەندێك هەر یەکجار زۆر دەوڵەمەند بون ، ئەوانە بە هۆی سەربازی تایبەتی خۆیانەوە هـەمو ڕێـگا بازرگانییەکانیان گرتبـوو ، خواردنی قەڵاکانیان دابین ئەکرد • بازرگـانە سپی پێستەکان ئەبوا لەگەل سوڵتانە ئەفەریقاییەکانا بـە باشی ڕەفتاریان بکردبایە ••

لە ئەفەریقای ڕۆژئاوادا کۆیلەکانیان لە بازاڕەکانا کۆ ئەکردەوە ، بۆ ئەوەی ڕانەکـەن ، بە زنجیر پێکەوەیان ئەبەستن ، کۆیلەکان وا تێ ئەیشتبون کـە سپی پێستەکان ئەیانخۆن ، لەبەر ئەمە لـە حاڵەتێکی دەرونی ترسناکدا بون • بازرگانەکان دوان دوان لاقی ڕاستو چـەپی کۆیلەکانیان لە ڕێـگادا پێوەند ئەکرد ، شەوانیش ئەڵقەی تەل یان ئاسنیان لەمل ئەکردنو هەردو دەستەکانیان کەلەپچە ئەکردن تاکو ڕانەکەن ••

جـگە لەوەی کە زۆر بە وردی چـاودێری هـەمو جموجوڵەکانیان ئەکردن •• زوربەی ئەم کۆیلانە حەپسی بون یان خەڵـکی قەرزدار بون •

هەندێك لە وڵاتە ئەفەریقاییەکان وەکو «شانتی»و «داهومی» بـە تایبەتی بەهۆی ئەو چەکـە گەرمانەوە کـە لە ئەوروپاییەکانیان ئەکڕی کۆیلەکانیان بە دیل ئەگرت •• سوڵتانو بازرگانە ئەفەریقاییەکان لـە

کەنارەکانا کۆیلەکانیان ئەکڕیو لە قەڵاکانا بە بازرگانە سپی پێستەکانیان ئەفرۆشتن‌و ، لەگەل٠کەلوپەلی پێویستی‌و چەکی تازەدا ئەیانگۆڕینەوە •

بازرگانە سپی پێستەکان کاتێك کۆیلەکانیان ئەکڕی هەریەك بە ئاسنێکی گەرم شوێنێکیان داخ ئەکردن بۆ ئەوەی لەگەل یەکتری دا نەگۆڕێن •• هەروەها نیشانەی داخی هەر بازرگانێك لەگەل بازرگانێکی ترا لە یەکتر جیا بون • ئینجا لە قەڵاکانا رایان ئەگرتن تاکو کەشتی بارهەڵگر ئەهاتن‌و ئەیان ناردن •

لە کەشتی‌یەکاندا کۆیلەکانیان ، ژن‌و پیاو پێکەوە شەتەك ئەدا ، لە هەر کەشتی‌یەکدا نزیکەی ٤٠٠ کەسیان تیا بار ئەکرد ، هەروەکو مردووی ناو گۆڕ لە تەنیشت یەکەوە لە چاڵی کەشتی‌یەکەدا رایان ئەکێشان •

ئەگەر یەکێکیان بکەوتبایەتە حاڵەتی مەترسی‌و مردنەوە ، ماوەیان ئەدا چەند سەعاتێك لە چاڵەکە بێتە دەرەوە لە سەر روی کەشتی‌یەکە هەناسەی پاك هەڵمژێت •• بۆ ئەوەی لەشیان خاو نەبێتەوە بە زۆری قەمچی هەڵیان ئەپەڕاندن •

زۆر جار کۆیلەکان هەوڵیان ئەدا خۆیان فڕێ بدەنە دەریاکەوە ، بەڵام کەشتی‌یەوانەکان بەهەر چوار دەوری کەشتی‌یەکانیانا تۆڕێکی دە مەتری یان لکاندبو بە کەشتی‌یەکانەوە بۆ ئەوەی کۆیلەکان نەتوانن باز بدەنە ناو ئاوەکەو رابکەن • لە ماوەی سەفەرەکەدا زۆر جار کۆیلەکان لەبەر برسێتی‌و ناخۆشی باری ژیانیان لە کەشتی‌یەکانا ئەمردن •

بەراورد کراوە لە سەدەی هەژدەیەمدا چوار یەکێکی هەمو

کۆیلەکان لە رێـگادا مردوون ، لە دوای ئەوەی کۆیلەکانیان ئەگەیاندە بەرەوە چەند ژەمێك خواردنی باشیـــان پێ ئەدان‌و ســــەرو چـــاویان ئەشۆرین •• بە تایبەتی کاتێك ئەیانبردن بۆ بازاڕی فرۆشتن ، لــە پێشا سەرو چاوو لەشیان بە رۆنی زەیتون چەور ئەکردن تاکو پێستە کانیـــان شەوق بداتەوەو خەڵك وا تێ بگەن تەندروستی‌یان تەواوە •

لە کاتی فرۆشتنی دا هەروەکو ئاژەڵ بە هێزو قەڵەوە کانیـان لـــە لایەکـــەوە ریز ئەکردن‌و لــەڕو لاوازو نوقستانە کانیشیان لە لایەکی ترەوە را ئەگرتن •

بازرگانێك لە تەنیا کاروانێکی دا لە ساڵی **١٧٦٧** دا جگە لەوەی لــە کۆمەڵێکی **٦٣٠** کۆیلەیی سەد کۆیلەیان لە رێـگادا مردبون کەچی هێشتا **٢٤** هەزار «پوند»ی قازانج کردبو • لەو کاتەدا کرێکارێکی بەریتانیـایی لـە هەفتەیەکدا کەمتر لـــە پێنج «شلینگ»ی وەر ئەگرت ، کەوابو **٢٤** هەزار پوند پارەیەکی یەکجار زۆرە •

بەندەرەکانی وەکو : لیورپول‌و بریستول‌و لەندەن لە بەریتانیـادا ، بوردوکس‌و نانتس لە فەرەنسە ، ئەمستردام لە هۆلەندە ، لیشبون لــــە پورتوگال‌و کـادیز لە ئەسپانیا ، هەمیشە پڕ بون لە بازرگانی کۆیلە کڕو کۆیلە فرۆش •• هیچ جێـگای سەر سوڕمان نیە یەکێك لـە دوژمنەکانی کۆیلە داری وتویە :

« هەموو خشتێکی دیواری خانووەکانی ـ لیۆ رپۆل ـ بە خوێنی کۆیلە ئەفەریقایەکان دانراوە » •

لــە سەرەتاوە بازرگانە ئەفەریقایەکان لە ئەفەریقادا رێژی کۆیلـە

---

(١) Pond. (٢) Slieng.

رەش پێستە کانیان ئەگرت ، بەڵام تاکو سەدەی حەڤدەیەم زوربەی سپی پێستەکان لەو باوەڕە دا بون کــە رەش پێستەکان هەر لە بنەچەوە پەستن‌و هەروەکو لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە ، ئەفەریقاییەکان ئەبێت هەمیشە کۆیلە بن ، وە ئەمە لە ئەنجامی گوناهباری خــۆیان پێستیان رەشە •• بەڵــگە یەکی تری هۆی ئەوەی کــە سپی پێستەکان هانی بازرگــانی کۆیلەکان ئەدەن گوایە ئەوەیە کـــە سپی پێستەکان ناتوانن لە ناوچـــە گەرمـــە سێری‌یەکانا کار بکەن •• بەڵام ئەم بەڵــگەیە ئەمەندە بایەخی نیە چونکە لە سەدەی حەڤدەیەمدا زۆر جار سپی پێستەکان بە پێی پەیمان نامـــەی کار کردن رێ ئەکەوتن شان بە شانی رەشەکان لە ناوچە گەرمە سێرەکانی ئەمەریکادا کار بـکەن •

بەریتانیاییەکان لـەو باوەڕەدا بون خۆشگوزەرانی خەڵکی بەریتانیا بە هۆی ئەو کەل‌و پەلانەوەیە کە کۆیلە رەشەکان لە ئەمەریکادا بەرهەمی ئەهێنن •

ئـــەو کۆیلانەی ئەبران بۆ ئەمەریـکا لـە بەندەرەکانی ئەمەریکا دائەبەزێندران‌و ئەفرۆشران ، ئەمە شتێکی زۆر ئاسایی بوو کۆیلە کانیان جەڵە ئەکردو لە مەیدانەکانا وەکو ئاژەڵ نیشانی خەڵــکی‌یان ئەدان تاکو کڕیارەکان بە ئارەزوی خۆیان هەڵیان بژێرن •• هەرکەس پارەی زۆر تری بدابایە بەو کەسەیان ئەفرۆشتن •

لە ئەمەریکا کۆیلە رەشەکان بە بەشێك لە سامان دائەنران ، خاوەن کۆیلەکان وەکو ئاژەڵ‌و کەلوپەلی ناومـــاڵ سەیری کۆیلەکانیان ئەکردو ئەیانفرۆشتن خێزانێك کە بە کۆیلەیی ئەگیران بە ئارەزووی بازرگانەکان یان بلێین خاوەن کۆیلەکان دابەش ئەکران‌و ئیتر ئەندامانی ئەو خێزانــە

یەکتری یان نە ئەبینیەوە • ئەو کۆیلانەی لە ئیش‌و کاردا سست بونایـە شەلاخکاری یان زنجیر کاری ئەکران ، یان بە ئاگر داخیان ئەکردن • لە ولاتی بەرازیل بە زۆری ئەیانکردن بە سەرباز ، خاوەن کۆیلەکـان سپی پێستە کانیان ئەکرد بە چاودێر لەسەر کۆیلەکان ئەوانیش زۆر بێ بەزەییانە لەگەلیانا ئەجولانەوە • هەندێکیش لە خاوەن کۆیلەکان کـە خاوەن بەزەیی بونایە لەگەل کۆیلە کانیانا بە پیاوانە رەفتاریان ئەکرد • وەکـو ئەڵێن خـاوەن کۆیلە بەریتانیایی‌و هۆلەندی‌یە کـان زۆر بێ بەزەییانە لەگەل کۆیلەکانا ئەجولانەوەو رەفتاریان ئەکرد •

کۆیلەکان بە پێی یاسای کۆیلەچێتی ئەژیان ، هەموو ئەو یاسایانەی لـە بارەی کۆیلەوە دەرچوبون رەشەکانیان بە پەست دائەنا ئیتر ئازادبێت یان کۆیلە •• تەنانەت هـەندێك لەرەش پێستەکانیش ئـەم بیروباوەڕە چەوتەیان بەراست ئەزانی •• ژن خواستن لە نێوان رەش‌و سپی‌یەکـانا بە یەکەوە قەدەغە بوو ، بەلام هـەندێك لە خـاوەن کۆیلەکان دڵـداری رەشیان هەبو ، ئەمـکارە بووە هۆی ئەوە کە نژادی دوو رەگ(*) لـە ئەمەریـکادا بکەوێتەوە •

★ ● ★

(*) دووڕەگ ، بەو زایندە ئەڵێن کە لە تۆرمی دوو رەگـەز بوبێت ••
**وەرگیر**

# راپەڕینی کـۆیلەکان

کۆیلەکان لە بارەی مەسەلەی کۆیلەوە هیچ رایەکیان نەبو ، لـــە ئەفەریقادا کۆیلەکان لەگەل ئەو کەسانە ئەکەوتنە شەڕەوە کە ئەیانویست بە دیل بیانگرن .. لە دەریاکانا هەندێک جـار کۆیلەکان راپەڕیــون‌و کەشتی‌یەکانیان فڕاندووە ، لە ئەمەریکا هەندێك لە کۆیلەکان بــە نەرمی بێزاری خۆیان دەربڕیوە ، یان سەرپێچی یان لە ئیش‌و کارو فەرمـــانی خـاوەنەکانیــان کردووە ، چەرخی ئیشکردنیان بە قەستی شکاندووە ، هەندێـکیان کـــە ئـــازاو لێ‌وەشـــاوە بون رایان کردوەو شۆڕشیان هەلگیرساندوە(١) ئەو کۆیلانەی کە ئەیانتوانی رابکەن شوێنیان ئەکەوتن ، هەر کات بیانگرتبانایە زۆر سزاو ئازاریان ئەدان . لەبەر ئەمـــە کۆیلە راکردوەکان پەنایان ئەبردە چیاو چۆڵ‌و دارستانە چڕەکان ..

کۆیلە راکردوەکان ئەیانتوانی لـــە کوێستانەکـــانی پارێزگای «کۆك پیت» لە ناوەندی «جامایکا»و دارستانەکانی

---

(١) هەروەکو راپەرینەکەی «سپارتاکوس» لە ٧٣ـ٧١ی بەرلەزاینی لە ئیتالیا .

«سارنیام» بە سەربەستی بژین •• ئەنانەت لەگەل ئەوروپا
یەکانا رێک بکەوون •

لە «بەرازیل» چەند دەستەیەك کۆیلەی رەش کۆمارێکی سەر بەخۆیان لە «پارلماس» دامەزراند ، ماوەیەك لە سەدەی حەڤدەیەمدا بەرامبەر بە هۆلەندەیەکانو پورتوگالییەکان راوەستان کە ئەیانویست کۆمارەکەیان لەناو بەرنو دەسگیریان بکەن •

خاوەن کۆیلەکان هەمیشە بیریان لە شۆرشو راپەرینی کۆیلەکانیان ئەکردەوەو لێی ئەترسان ، لە ناوچە ژێر دەستەیەکانی ئەمەریکادا زۆر جار شۆرشی کۆیلەکان رویداوە ، بەلام شورشەکانیان وەکو ئاژاوەیەکی کەم خایەن وەها بووە ، کە بە زوویی سەرکوت ئەکران • تەنیا شۆرشی سەرکەوتوانەیان ئەوە بوە کە لە دورگەکانی «ئانتیل» لە دورگەی «ساندو مینگو» رویدا •• «توسن لورتور» کە سەرەتا کۆیلە بو ، لەبەر مەودای کاریگەرێتی شۆرشی فەرەنسەدا رابەری ئەم راپەرینەی کرد ، ناوبراو فەرماندەیەکی لێ وەشاوە بوو ، سەرکەوتن بەسەر سوپای ئەسپانیاو فەرەنسەدا گەلێك یارمەتی یەکەمین کۆماری رەش پێستەکانی «هایت»ی دا • بەریتانیاو فەرەنسە بۆ کۆتایی هێنان بە مەسەلەی بازرگانێتی کۆیلەکان چەندان ئەنجومەنی یاساییان پێك هێنا • «دانیمارك» یەکەمین ولاتێك بو کە بازرگانی کۆیلەی بە کارێکی نایاسایی دانا •• دەولەتی شۆرشگێری فەرەنسە لە سالی ١٧٩٤ دا هەمو کۆیلەکانی ئیمپەراتوری ئازاد کرد • بەلام زۆری پێ نەچو ناپلیۆن سەر لەنوێ یاسای کۆیلەداری دانایەوە •• لە سالی ١٨٠٧ دا یاسایەکی تازەی دانا•• فرۆشتنی رەشەکانی ئەفەریقای بە خەلکی بەریتانیا قەدەغە کرد • ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاش یاسایەکی بەمجۆرەی لە سالی ١٨٠٨ دا

دەرکرد ، دوای ئەوە ولاتە ئەوروپاییەکان یەك لـە دوای یەك پەیڕەوی ئەمەریکایان کرد ..

نابێ ئەوەمـــان لەبیر بچێت کە ئەمـکارە تەنیـا ، کەمکردنەوەی بازرگانی کۆیلە بوو نـەك لەناو بردنی سیستەمی کۆیلەداری ، چونـکە هێشتا لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو زوربەی ناوچە ژێردەستەیەکانی ئەوروپادا کڕین و فرۆشتنی کۆیلەکان هەر ماوەتەوە ..

لە واقیعدا ئـــەم یاسایانە کارێـکی ئەو تۆیان نەکردە سەر باری بازرگانێتی ئەو کۆیلانەی لە ئەفەریقاوە ئەبران بۆ ئەمەریـــکا ..

هەندێك ولاتان بە تایبەتی «ئەسپانیا ، پورتوگال ، کوبا ، بەرازیل» ، کۆتاییان بە بازرگـــانی کۆیلە هێنا ، دەوڵەتی بەریتانیا ئەو کارخـانانەی داخست کە کۆیلەکان کاریان تیا ئەکردن .

کــــەشتی بەریتانیاییەکــــانو سەربازە ئەمەریـــکاییەکان لە ئاوی «ئوقیانووسی ئەتڵەسی» دا رێـــگایان بـــە کەشتییە بازرگـــانییە کۆیلە هەڵـگرەکان ئەگرت ، هێزە دەریاییەکانی ئەفەریقـــای رۆژ ئاوا لـــە «فریتون» و «لیبریا» گەلێك کۆیلەیان ئازاد کرد ، بەڵام تاکو ساڵی ١٨٦٠ ئەو بازرگانانەی سەرپێچییان لە یاسای ئازاد کردنی کۆیلەکان ئەکرد ، درێژەیان بە بازرگانی کۆیلەکان هەر ئەدا ..

بازرگانی کۆیلەکان لە کەنارەکانی «ئوقیانووسی ئەتلەسی» دا لـــە دوای ساڵی ١٨٤٠ بە گورجی لەناو چوو .

شەڕو شۆڕش لە پێناوی کۆتایی هێنان بە کۆیلەداری‌و «ئازاد کردنی کۆیلەکان» تا کۆتایی سەدەی نۆزدیەم درێژەی کێشا .. لـــە ناوچـــە ژێردەستەکانی بەریتانیا «واتا دورگەکانی ئانتیل ، ئەفەریقای خـواروو ، موریتانیا» کۆیلەکان لە دوای سالّی ١٨٨٣ ئازاد کران . لـــە فـەرەنسە کۆیلەکان لە سالّی ١٨٤٨ دا ، وە لە زوربەی ولاٌتەکـــانی ئەمەریـکای خوارو لە سالّی ١٨٥٠ دا ئازاد کران . لە سالّی ١٨٦١ ناوچەکانی خوارو لـــە ولاٌتە یەکگرتووەکان جیـــا بونەوەو کۆیلەکانیان ئازاد کرد . لـــە ئەنجامدا ریژیمی کۆیلەداری لە سالّی ١٨٨٠ دا بە تەواوی لەناو چـــوو هەموو کۆیلەکان ئازاد بون .

★ ● ★

# ئەنجامی بازرگانی کۆیلەکان

**بـە کورتی :**

بازرگانی کۆیلەکان بوو بە هۆی ئەوە ملیۆنەها لە رەش پێستەکـان بـە هەمو ناوچەکانی جیهاندا بڵاو ببنەوە •• ئەمە گرنگترین ئەنجـامی بازرگـانی کۆیلەکان بو ، پادشاکان بۆ گرتنی کۆیلە شـــەریان هـــەڵ ئەگیرساند • پەیوەندی بازرگانێتی نێوان ئەفەریقاو ئەوروپا ، کەلو پەلی بازرگانی تازەو بەرو بومی خواردەمەنی ئەمەریکایی وەکو گەنمەشامیو •• دۆزرایەوە • کۆیلەکـان لەگـەل خۆیانا ، زمان ، نەریتی کۆمەڵایەتی ، مۆسیقا ، بیرو باوەڕی خۆیان برد بۆ ئەمەریکا ••

کار تێکردنی فەرهەنـگی ئەفەریقایەکان لە ئەمەریکادا ، جـــازو چەندان جۆری تری ئالەتی مۆسیقا ـ کە ئیستا لە ئەمەریکادا باوە ـ لـــە رەگەزو بنەچەدا ئەفەریقایین چیرۆکە ناوچەیەکانی دورگەکانی «ئانتیل» لەگەل داستانە ناوچەیەکانی رۆژ ئاوای ئەفەریقادا لە زوربەی وڵاتەکانی ئەوروپاو ئەمەریکادا بڵاو بونەوە •

---

(١) Antiel.

**سوپاس :**

زۆر سوپاسی هونەرمەند کاك نەوزاد توفیقی خۆشنووس ئەکـــەم ناونیشانی بەرگی ئەم پەرتوکەی بۆ نوسیم ..

